ژ10 و 11 و 12 و 13 ی ساڵی 6- 7 ی تەموز و ئاغستوس و ئەیلول و تشرینی یەکەمی 952.
ئەم ژمارانە پێکەوە دەرکراون. 4 لاپەرەی فولسکابە. بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە. هەموی بە کوردی نوسراوە.

بۆ رونکردنەوەی هۆی دەرنەچونی رزگاری و دەرچونی چوار ژمارەی پێکەوە، لە پاینی دوا لاپەرەدا نوسیویانە:

"لە بەر ئەمەی کە رۆنیۆ گرفتی تیدا پەیدا بو رزگاری بەینێک دەرنەچو"

دو بابەتی تێدایە:

سەروتارەکەی دەربارەی (کۆنگرەسی نۆزدەمینی پارتی کۆمیۆنیستی سۆڤێتی مەزن) بەیاننامەیەکە پارتی لە 5 ی 10 ی 1952 دا بەو بۆنەیەوە دەری کردوە.

ل1- 4، لە بابەتی (ئەو هەڵبژاردنەی لە پێشمانە) دا، داوای پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتوی کردوە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی تازە.

مام جەلال لە هەمان نامەدا بۆی نوسیبوم:

"رزگاری دەوری دوەم لە ساڵی 1951 ەوە مامۆستا برایم سەرنوسەر و نوسەری وتارە گرنگەکانی بو. بەکوردی دەردەچو. لە کەرکوک چاپ دەکرا بە رۆنیۆ.

"تایپەکەی، خوالێخۆشبو میرزا فەندی عەبدولکەریم دەیکرد کە باشکاتبی مەحکەمە بو.

"رۆنیۆکەی، شەهید عەلی حەمدی دەیکرد کە موبیری تاپۆ بو لە کەرکوک.

"دابەشکردنەکەی، مام جەلال دەیکرد کە خوێندکار بو لە کەرکوک.

"مام جەلال لە هەندێ کورتە باس بەولاوە هیچی تێدا نە نوسیوە. زۆربەی زۆری نوسینەکان هی مامۆستا برایم ئەحمەد خۆی بو."

### سێیەمین کۆنگرەی پارتی

لە 26 ی کانونی دوەمی 1953 دا سێیەمین کۆنگرەی پ د ک لە کەرکوک بەسترا.

لەم کۆنگرەیەدا گۆرینی بنەرەتی لە پرۆگرامی پارتی و دروشمەکانیدا کرا:

- ناوی پارتی دیموکراتی کورد-عیراق کرا بە پارتی دیموکراتی کوردستان.
- بەربەرەکانی دەرەبەگایەتی و ریفۆرمی زەوی و داکۆکی لە جوتیاران.
- تەئمیمی نەوت و پیشەسازیە گرنگەکان.
- داکۆکی لە مافی کرێکاران.
- رەتکردنەوەی بێلایەنی لە کاروباری ناودەوڵەتاندا.
- پشتیوانی لە ئۆردوگای سۆسیالیستی و دوژمنایەتی ئیمپریالیزم.
- هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتننامەکانی عیراق و بریتانیا.
- روخاندنی رژیمی پاشایەتی و دامەزراندنی جمهوریەتێکی دیموکراتی گەلی و ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد، خرانە ناو پرۆگرامی نوێی پارتیەوە.

هەر لەم کۆنگرەیەدا بریار درا رێکخراوی تایبەتی بۆ قوتابیان و لاوان و ئافرەتان دروست بکرێ.

لە 18 ی شوباتی 1953 دا یەکێتی قوتابیانی کوردستان-عیراق و. هەر لەو دەوروبەرەدا یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان- عیراق و. یەکێتی ئافرەتانی دیموکراتی کوردستان دامەزران. ئەم ڕێکخراوانە، کە لە لایەن سەرکردە و کادرە پێشکەوتوەکانی پارتییەوە بەڕێوە ئەبران. بۆ ئەوەی بیرو بۆچونەکانیان بڵاوبکەنەوە و. جەماوەر رابکێشن. هەر بە دەزگای چاپی پارتی کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەیان و ئۆرگانی تایبەتی خۆیان. یەکێتی لاوان (خەباتی لاوان) و یەکێتی قوتابیان (دەنگی قوتابیان) یان دەرکرد. ئەگەرچی ڕێکخراوی تایبەتی بۆ جوتیاران دانەمەزراند، بەڵام بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی سیاسیی جوتیاران (درکەی جوتیار) ی دەرکرد.

سەرکردایەتی نوێی پارتی، لە دوای کۆنگرەی سێیەم، چەپایەتی کردە ڕێبازی حیزبەکە و. هەوڵی ئەدا بیسەلمێنی کە ئەمان لە شیوعیەکان مارکسیترن و. لە شەڕی ساردی نێوان یەکێتی سۆڤێت و وڵاتانی ڕۆژئاوادا ئەمان گەرمترن.

### 5. 3. رزگاری، خولی سێیەم

هەندێ ژمارەی رزگاریی خولی سێیەم لە بەر دەس دان.

ژ1 ی س7، مانگ و ساڵی بڵاوبونەوەی لە سەر نیە، بەڵام ئەبێ هی 1953 بێ.

رزگاری، جاران لە ژێر ناوەکەیدا ئەنوسرا:

"ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردی-عیراق"

لەم ژمارەیەوە نوسراوە:

"ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان-عیراق" و. دروشمەکانیشی گۆڕاوە.

لە لای ڕاستیدا نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵکی نەبەردی کوردستان خەبات کردنتان لەرێگەی پاراستنی ئاشتیدا خەبات کردنە لە ڕێگەی رزگاری و سەربەستی کوردستاندا.

"پایەدار و سەرکەوتو بێ خەباتی گەلان لەرێگەی پاراستنی ئاشتیدا.

"بروخێ پیلانی شەڕهەڵگیرسێنەری ئیمپریالیستە پیاو خۆرەکان"

لە لای چەپیدا نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵکی عێراق! خەبات بکەن بۆ ئەوەی ڕۆژێک زوتر لە بەینی هەمو دوژمنەکانی ئیمپریالیزمدا، لە بەینی کرێکاران و جوتیاران و بیرڕوناکان و کاسەبە و سنعەتکاران و سەرمایەدارانی نیشتمانیدا، بەرەیەکی یەکگرتو پێک بهێنرێت."

سەروتارەکەی بریتییە لە "وێنەی ئەو پرسەنامەیەی پارتی دیموکراتی کوردستان- عیراق بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمیۆنیستی سۆڤێتی ناردوە" هەروەها "پرسەی ئەندامان بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بەبۆنەی کۆچی دوایی سەرکردەی مەزنی مرۆڤایەتی پێشکەوتو ستالینی مەزنەوە"

لاپەرەی 3 تەرخان کراوە بۆ (بەیاننامەی پارتی بە بۆنەی نەورۆزەوە) کە لە 21 ی 3 ی 1953 دا دەرچوە.

ژ6 ی س7 ی ئاغستۆسی 1953.

کلێشەکەی گۆڕاوە بۆتە مۆر و جوانتر بوە لە جاران. لە سەری لاپەڕەکە نوسراوە: "ئاشتی- دیمۆکراسی- سەربەخۆیی". دروشمەکەی گۆڕاوە و بۆتە جۆرێ لە پرۆگرامی کاری سیاسی حیزب، نوسیویێتی:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی داگیرکراوی عێراق، ئەی کۆمەڵانی خەڵکی بەشەرەفی عێراق!

خەبات بکەن بۆ ئەوەی ڕۆژێک زوتر لە بەینی دوشمنانی ئیمپریالیزمدا، لە بەینی کرێکاران و جوتیاران و بیرڕوناکان و کەسەبە و سنعەتکاران و سەرمایەدارانی نیشتمانیدا بەرەیەکی یەکگرتو پێک بهێنریت بۆ جێبەجێ کردنی ئەم داخوازیانەی ئامانجی ئیمڕۆی هەمو دوشمنانی ئیمپریالیزمن لە عێراقدا:

پاراستنی وڵات لە مەترسی شەڕ بە بەهێزکردنی بزوتنەوەی ئاشتیخوازی و نەهێشتنی هەمو بنکە و فڕۆکەخانەیەکی جەنگی و گشت لەشکر و سوپایەکی بێگانە لە سنوری دەوڵەتی عێراق دا و، بەرهەڵستی کردنی پەیمانی پاراستنە درۆزنەی ڕۆژهەڵاتی کە ئیمپریالستەکان عەودالین، لە ژێر هەر پەردەیەکدا ئەبێ بێ.

ڕمانـدنی ڕێژیمی کۆنەپەرستی و دەرەبەگی و پۆلیسی و دیکتاتۆری بۆگەنی ئێستەی عێراق و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیموکراتی بەدڵی گەل.

دابینکردنی هەمو جۆرە سەربەستیەکی دیموکراسی بۆ گەلی عێراق.

دەستخستنەوەی سەربەخۆیی ڕاستەقینە و تەواوی عێراق بە لابردنی هەمو ئەو پەیمان و ڕێکەوتنە زۆرەدارانەیەی ئیمپریالیزم لە گەڵ نۆکەرە نیشتمانفرۆشە عێراقیەکانی بەستویە.

دەستخستنەوەی سەربەخۆیی ئابوری (اقتصادی) تەواوی عێراق بە نەهێشتنی هەمو ئەو ڕێکەوتن و ئیمتیازانەی سەروەت و سامانی وڵاتیان پێ بە تاڵان دراوە بە کۆمپانیا ئینحیصاریەکانی بێگانە."

لە داتی سەروتار: "بانگی پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عیراق و حزب وحدة الشيوعيين في العراق"

"لە ڕێگەی بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتودا"

(لە سەرەتای مایسی 953 دا نوێنەری هەردو پارتی کۆبونەوە...

هەمان ژمارە (بەیاننامەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بە بۆنەی دامەزراندنی حکومەتی نەتەوایەتی کوردستانەوە) ی بڵاوکردۆتەوە.

ژ2 ی س8 ی مارتی 1954. باسەکانی بریتین لە:

بەیاننامەی 5 ی 3 ی 1954 ی پارتیە بە بۆنەی (بیرەوەری یەکەمینساڵی کۆچکردنی ستالینی مەزن) ەوە.

لەم بەیانەدا ئەڵێ:

"پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عیراق لەم ڕۆژەدا کە یادی یەکەمین ساڵی کۆچکردنی ئەم قارەمانە بلیمەتەی دنیا و ئەم باوکە دڵسۆزەی نەتەوەی کوردی چەوساوە و زۆرلێکراو ئەکاتەوە، بانگی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ئەکا بۆ هەڵگرتنی چەکی لە خەباتدا قاڵبوی مارکسیزم - لینینیزم، ئەو چەکەی قەیسەری لە ڕوسیادا ڕاماڵی و سۆشیالیزمی لە جێ دامەزراند، ئەو چەکەی هێزی پیاوخۆری خوێنمژی هیتلەری لە ناو برد، ئەو چەکەی هێزی یەکگرتوی ئیمپریالیزمی ئەمەریکی و کۆنەپەرستی چینی سەرەونگون کرد، ئەو چەکەی کە بێگومان کوردستانی دیلی پارچە پارچە کراویش بە سەربەخۆیی و یەکێتی و کامەرانی ئەگەیەنێ، پارتی دیموکراتی کوردستان-عیراق بەم بۆنە پڕ داخ و ئازارەوە بەڵێن ئەدا بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان کە لە سەر پەیڕەوی تەعالیمی کۆچکردوی ئەمرمان ئاڵای ئاشتی و سەربەخۆیی نیشتمانی و سەربەستی دیموکراسی هەڵگرێ، هەروەکو تا ئێستە هەڵیگرتوە و، دیدا بۆ پێشەوە."

"لە موحاکەمەی دکتۆر موصەدەقدا دیسانەوە شاهی خائین حوکم ئەدرێ" وتارێکە لە رۆژنامەی "مردم"ی حیزبی تودەی وەرگرتوە.

"پەیام بنێرەوە ئەو شوێنە پیسەی لێی دەرچوە" لە ژێر سەردێڕی وتارەکەدا ئەم پەندەی نوسیوە:

"ئەی گەلی ئەبەزی کورد ئیمپریالیزم سێ سەرە دوشمنتە: دوشمنی خۆتە، دوشمنی دۆستتە، دۆستی دوشمنتە."

ئەم وتارەی بە بۆنەی دەرچونی گۆڤاری (پەیام) ەوە نوسیوە. پەیام لە لایەن (کاروباری ئالوگۆڕی خوێندەواری ئەمەریکا) ی سەفارەتی ئەمەریکی لە بەغداد دەرکراوە.

"رێککەوتنی تورکیا- پاکستان هەڕەشە لە یەکیەتی خەبات و ئاشتی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەکا" وتارێکە لە شێوەی بەیاندا بە ئیمزای پارتیەوە بڵاوکراوەتەوە.

لە ژێر سەردێڕی "دەنگوباس" دا هەندێ هەواڵی سلێمانی و هەڵەبجەی بڵاوکردۆتەوە.

ژ2 ی س9 ی حوزەیرانی 1955. 6 لاپەڕەی فولسکابە. بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە.

لە لای راستیەوە نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵک تێکۆشن بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتو لە بەینی هەمو پارتی و دامەزراوە نیشتمانیەکان و هەمو دوژمنەکانی ئیمپریالیزمدا، بۆ لابردنی حکومەتی نوری سەعیدی خاین و هێنانی حکومەتێکی نیشتمانی.

لە لای چەپیەوە نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵک خەبات بکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی مەجلیسی داتاشراو، لابردنی مەرسوم و قانونە فاشیستیەکان، بەرەڵڵا کردنی هەمو سەربەستیە دیموکراسیەکان، سەربەستی نوسین و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ، سەربەستی کۆبونەوە و خۆنواندن، سەربەستی پارتی و کۆمەڵ و نەقابە دانان."

سەروتارەکەی: "بەرەی نیشتمانی یەکگرتو تەنها هێزە بتوانێ ئیمپریالیزم بشکێنێ و پرۆژەکانی ژێر خا". ئەم وتارە لە "نداء کردستان" وەرگیراوە.

بابەتێکی تری، بەیاننامەیەکی پارتیە لە 19 ی 6 ی 1955 دا لە ژێر سەردێڕی: "ئەی گەلی کوردی ئەبەز شەهیدانی رێگەی ئازادیت لەبیرنەچێ!" دەری کردوە بە بۆنەی یادی هەشت ساڵەی لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەوە.

لەم بەیانەدا نوسراوە:

"نەتەوەی کورد رێگەی رزگاری و سەربەخۆیی خۆی دۆزیوەتەوە کە ئەویش خەباتکردنی شۆڕشگێڕی و تێکەڵکردنی ئەم خەباتەی خۆیەتی لە گەڵ خەباتی هەمو گەلانی ئازادیخواز و ئاشتیپەرستی دنیا، شوێن سوپێری خۆی دۆزیوەتەوە کەوا لە کامپی ئاشتی و دیموکراسیدا کە سەرکردەکەی دۆستی مەزنی نەتەوەی کورد یەکیەتی سۆڤێتە...... چەکی خۆی دیوەتەوە کە ئەویش چەکی کاریگەری لە تەجروبە دەرچوی مارکسیزم - لینینیزمە"

بۆ یەکەمین جار لەم ژمارەیەدا بێ ناوی دانەر شیعری (دوا تیری کەوان) بڵاوکراوەتەوە. ئەم شیعرە، کە یەکێکە لە شاکارەکانی ئەدەبی بەرەنگاری- کوردی، ئیبراهیم ئەحمەد ساڵی 1948 لە زیندانی ئەبو غرێبدا دایناوە. سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

دوا تیری کەوانی خۆت بهاوێژە هەلە دوژمن

دوا سەرکەوتنی تۆیە دوا نوچی گەلە دوژمن
شەوی ترساندنت سامی نەماوە، تاریک و رونە
بە ئاسۆی نەرخەوانیدا هەتاو لەو دیو کەلە دوژمن

## بڵاوکراوەی تر

جگە لە (رزگاری) کە ئۆرگانی ناوەندی بوە، پارتی، بۆ رۆشـنبیریی پارتایـەتی بڵاوکـراوەی (رێگـەی نوێ) و بۆ هوشیارکردنەوەی جوتیاران (نرکەی جوتیار) و چەند پەخشەی تری بڵاوکردۆتەوە:

## 5. 4. نداء کوردستان

تەنیا یەک ژمارەی لە بەر دەس دایە ئەویش ژ2 ی مایسی 1956 ە، 6 لاپەڕەی فولسکابە. بـە تایـپ و رۆنیۆ چاپ کراوە، هەموی عەرەبی‌یە. بابەتەکانی ئەمانەن:

"لەپێناوی یەکخستنی جوڵانەوەی دیموکراتی شۆڕشگێڕ لـە کوردسـتانی داگیرکـراوی عیراقـدا" باسـی پێویستی و ناچاری یەکخستنەوەی حیزبەکانی کوردستان لە یەک حیزبی یـەکگرتوی پێشـڕەودا نـەکا. ئـەوە ئاماژەیە بۆ یەکگرتنەوەی هەردو باڵی هەمزە عەبدوڵا و ئیبـراهیم ئەحمـەد لـە پـارتی دیمـوکراتی یـەکگرتوی کوردستاندا.

"جوانڕۆ یەکەم قوربانی بو" لە رزگاری‌یەوە وەرگیراوە و تەواوکـەری ژمـارەی پێشـوە. سـەبارەت بـە پەلاماری ئەرتەشی ئێرانە بۆ سەر کوردی ناوچەی جوانڕۆ.

"گەوهەری دیموکراسی میللی" باسێکی تیۆری تەواونەکراوە.

## 5. 5. نرکەی جوتیار

ژ5 ی س1 ی ئەیلولی 1953 ی نرکەی جوتیار. دەوری ناوەکەی:

لای سەروی لێی نوسراوە: "زەوی بۆ جوتیار".

لای خواروی ئەم وتەیـەی سـتالین هێنراوەتـەوە: "جوڵانـەوەی نیشـتمانی لـە جەوهـەریدا جوڵانـەوەی جوتیارانە".

لای راست نوسـراوە: "برایـانی جوتیـار تێکۆشـن بـۆ لـە رەگوریشـەوە هەڵکەنـدنی شـێوەی ژیـانی دەرەبەگی، بۆ لابردنی دۆنم و سەربەستکردنی هەمو جۆرە کشـتوکاڵێک. بـژی برایـەتی جوتیـار و کرێکـار لەرێی ئاشتی و ئازادیدا"

لای چەپ ئەم شیعرە نوسراوە:
"گەلێ کە مێژوی بە خوێن نەنوسرێ،
چۆن تۆڵەی ژینی دوارۆژ وەرئەگرێ؟
یا کەی سەربەستی بە کەس دراوە؟
کە هەر بە خوێن و خەبات ئەسەنرێ"

دەرد و دەرمانی جوتیاران و دەنگـوباس لە بابەتەکانیەتی.

ژ6 ی س1 ی تشرینی یەکەمی 1953 و ژ7- 8 ی س1 ی تشرینی دوەم و کـانونی یەکـەمی 953 دەرچوە.

## 5. 6. رزگاری، بەرەی پێشکەوتو

هەمزە عەبدوڵا کە لە حیزب دور خرایەوە، بەو سزایە رازی نەبو. دریژەی دا بە چالاکی حیزبی:

لە لایەکەوە، دریژەی بە کاری رێکخراوەیی دا. کەوتە رێکخستنەوەی ئەندامانی لایەنگری خۆی، بە هەمان ناوی پێشویەوە: پارتی دیموکراتی کوردی- عیراق. بەڵام بۆ ئەوەی لە باڵەکەی تری حیزب جیا بکرێتەوە، بە کوردی (بەرەی پێشکەوتو) و بە عەرەبی (الجناح التقدمي) خستە سەر ناوەکەی.

لە لایەکی ترەوە، کەوتە دەرکردنەوەی رزگاری بە کوردی و عەرەبی.

هەندێ ژمارەی ئەم خولەی رزگاری، کە هەمزە دەری کردوە، لە بەر دەس دان. هەمان ریزی ژمارە و ساڵی رزگاری بۆ دانراوە. پێ ئەچێ مانگانە دو ژمارەی لێ دەرچوبێ. ژمارەیەکی بە کوردی و ژمارەیەکی بە عەرەبی. بەڵام وتارەکانی بە هەردو زمان هەمان بابەتن و تەرجومە کراون.

ژ3 ی س8 ی کانونی یەکەمی 1953. 15 لاپەرەی نیو فولسکابە لە شێوەی گۆڤاردا. بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە. دروشمە سیاسیەکانی لە سەروی ناوی رزگارییەوە نوسیوە:

"لە پێشرەوی گەلی کوردا خەبات ئەکەین:

1. بۆ رزگارکردنی عیراق رزگارییەکی سیاسی و ئابوری و ئایدیۆلۆجی لە ئیمپریالیزمی ئەنگلۆ- ئەمریکا و چینی کۆنەپەرستان.
2. بۆ رزگارکردنی چینی جوتیاران لە دەرەبەگ بە نابوتکردنی سیستەمی فیۆدالی لە زەویدا وە دابەشکردنی زەوی بە سەر جوتیاران.
3. بۆ پێکهێنانی حوکمێکی زاتی لە کوردستانی عیراق دا.
4. لە پێناوی ئاشتی و دیموکراتیدا."

سەروتار: "بەرەی پارتی و دەستە دیموکراتیە نیشتمانییەکان پێویستیەکی زۆر بە پەلەیە." ئەم وتارە پرۆگرامی پێشنیار کراوی بەرەی پێشکەوتوە بۆ هەمو هێزەکانی عیراق کە لە بەرەیەکی یەکگرتودا کۆ ببنەوە.

لە پاینی دوا لاپەرەیدا نوسیوێتی: "لە لایەن بەرەی پێشکەوتوی پارتی دیموکراتی کورد- عیراقەوە دەر ئەچێت.

ژ3 بە عەرەبی، هەمان بابەت و بە هەمان قەوارە و شێوە چاپ کراوە. لە پاینی دوا لاپەرەی عەرەبییەکەیدا نوسراوە: "صادرة عن الجناح التقدمي لبارتي ديموكراتي كورد- عراق".

ژ4 ی س8 ی کانونی دوەمی 1954، 12 لاپەرەی هەمان قەبارەیە. لە بابەتەکانی:

نامەی شێخێک،

پرۆژەی قەلاچۆکردنی مێشولەی لەرزوتا لە سلێمانی،

یادی لینین،

بێریای خائین،

یادی راپەرینەکەی کانونی دوەمی 1948 کە بەیاننامەیەکی 27 ی 1 ی 1954ی ئەو باڵەی پارتییە.

ئەم دو ژمارەیەی دوایی بە هەمان بابەت و مێژوەوە بە عەرەبی دەرکراون.

له پیش ره وی گه لي کوردا خه بات ئه که ین

١ ــ بو رزگار کردني عراق رزگاری یه کي سیاسي و ئابوری و ئایدولوجي له امپریالیزمي ئه نگلو ــ ئه مریکا وچیني کونه په رستان •

٢ ــ بو رزگار کردني چیني جووتیاران له ده ره به گ به نابووت کردني سیسته مي فیودالي له ره وتیا و دابه ش کردني زه وی به سه رجووتیاران •

٣ ــ بو پیك هیناني حکمیکي زاتي له کوردستاني عراقدا •

# رزگاری

ئورگاني پارتي دیموکراتي کورد
عـــــــراق

ژماره (٣) کانوني ( ١ ) ١٩٥٣ سالي ( ٨ )

٤ ــ له پیناوی ئاشـــــــــتیو دیموکراتیـــدا •

((نرخي ٢٠ فلسه ))

نناضل في طليعة الشعب الكردي [illegible] :

١ ـ لتحرير العراق سياسيا واقتصاديا وايدولوجيا من الاستعمار الانكلو ـ امريكي ومن حكم الطبقات الرجعية

٢ ـ لتحرير الفلاحين من ظلم الاقطاعيين وكبار المالكين بالغاء نظام التملك الاقطاعي للارض واعطاء الارض للفلاحين

# رزگاری

٤ ـ في سبيل السلم والديموقراطية

لسان پارتي ديموكراتي كورد ـ عراق

العدد (٣) كانون الاول ٩٥٣ السنة (٨)

٣ ـ من اجل ممارسة الشعب الكردي لحقوق الحكم الذاتي على كوردستان العراقية

ئه پیش ره وی گه لی کورد ا خه بات ئه که ین ؛

١ ــ بو رزگارکردنی عراق رزگاریه کی سیاسی و ئابوری و ئایدیولوجی له امپریالزمی ئنگلو ــ ئه مریکا و جینی کونه په رستان •

٢ ــ بو رزگارکردنی جینی جوتیاران له ده ره به گ به نابــوت کردنی سیستمی فیودالی له زه ویا و دابه ش کردنی زه وی به ســـه ر جوتیاران •

٣ ــ بو پیک هینانی حکمیکی زاتی له کورد ســتانی عراقدا •

٤ ــ له بیناوی ئاشـــتیی دیموکراتیدا •

# رزگاری

ئورگانی پارتی دیموکراتی کورد ــ عراق

ژماره (٤) کانونی دوم ١٩٥٤ سالی (٨)

((نرخی ٢٠ فلسه ))

ژ5 ی س8 ی مـارتی 1954، 16 لاپەڕەیـە و ئەمـە لەسـەر بەرگەکـەی زیـادکراوە: "تێکۆشـن بـۆ پوچەڵکردنەوەی پـڕۆژەی هاوپـەیمانی لـە گـەڵ پاکسـتان- تورکیـادا و، دژی خۆبەسـتنەوە بـە ئیسـتیعماری ئەمریکی و بریتانی".

ناوەڕۆکەکەی ئاوایە:

"لەنێوان پەیمانی سەعداباد و ئیتیحادی عەرەبی و پەیمانی عەسکەری تورکیا- پاکستان دا"

"یادی ستالین" بەیاننامەیەکی 5 ی 3 ی 1954 ی بەرەی پێشکەوتوی پارتییە و، لەبارەیەوە نوسراوە:

"ئەی رۆڵە ئازادیخوازەکانی میللەتەکەمان! بـۆ پیـرۆز راگرتنـی یـادی سـتالینی نـەمر و بـەجێهێنانی رێنوێنیە شۆرشگێڕیە بەزەبرەکانی، داواتان لێ ئەکەین پێوەندیتان بە حیزبەکەمانەوە کـە بـە رێگـەی لینـین- ستالین دا ئەڕوا پتەو بکەن و، زیاتر و زیاتر لە دەوری جەنەراڵ مستەفا بارزانیی پێشەوامان و قوتابییـەکی ستالین خڕبنەوە"

"مەبەستی خۆپیشاندانە جەماوەریەکان لە سلێمانی" و "هەندێ هەواڵ".

ژ6 ی س8 ی نیسانی 1954، 12 لاپەڕەیە. باسەکانی بریتین لە:

مەینەتی بارزانیەکان،

ئەگبەتی لافاو،

گۆڕانکاریەکانی سیاسەتی ناودەوڵەتان.

ژ7 ی س9 ی تشرینی دوەمی 1954، 8 لاپەڕەیە، بە یەک وتاری تایبەت بە "ئەو هێزانەی کارئەکـەن لەپەنا کارەساتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا" پڕکراوەتەوە.

بـەرەی پێشـکەوتو بەیانیشـی دەرکـردوە، لـەوانـە: بـەیانێک لـە 16 ی 12 ی 1953 دا کـە داوای پێکهێنانی حکومەتێکی نیشتمانی دیمۆکراتی و، بەردانی زیندانیە سیاسیەکان و پێکهێنانی بـەرەی یـەکگرتوی کردوە و، پشتیوانی لە مانگرتنەکانی کرێکاران و راپەڕینی جوتیاران ئەکا.

**5. 7. خەباتی کوردستان، ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی یەکگرتوی کوردستان**

لـە هـاوینی 1956 دا هـەردو باڵەکـەی پـارتی: پـارتی دیمـۆکراتی کـورد- بـەرەی پێشـکەوتو بـە سەرکردایەتی هەمزە عەبدوڵا و، پـارتی دیمـۆکراتی کوردسـتان بـە سـەرکردایەتی ئیبـراهیم ئەحمـەد یـەکیان گرتەوە (پارتی دیمۆکراتی یەکگرتوی کوردستان) یان پێک هێنا و، لە باتی رزگاری (خەباتی کوردستان) یـان کرد بە ئۆرگانی ناوەندی. خەباتی کوردستان بە عەرەبی نوسراوە.

هەندێ لە ژمارەکانی لە بەر دەس دان، لەوانە:

ژ3 ی س1 ی مایسی 1957، لە سەری لاپەڕەکەدا نوسراوە: "نناضل من اجل حق شعبنا الكردي فـي تقرير مصيره بنفسه"

لە ژێر ئەویش دا: "السلام - الديمقراطية- الاستقلال"

لە تەنیشت ناوی گۆڤارەکەوە نوسراوە: "نناضل من اجل:

التحرر من الاستعمار وحلف بغداد، حكومة وطنية، الظفـر بالحريـات والحقـوق الديموقراطيـة للشـعبين الكوردي والعربي"

تناضل في طليعة الشعب الكوردي :

١ ـ لتحرير العراق سياسيا واقتصاديا وآيديولوجيا من الاستعمار الانكلو ـ امريكي ومن حكم الطبقات الرجعيـــة .

٢ ـ لتحرير الفلاحين من الاقطاعيين وكبار الملاكين بالغاء التملك الاقطاعي للأرض واعطاء الارض للفـــلاحيـــن .

٣ ـ من اجل ممارسة الشعب الكوردي لحقوق الحكم الذاتي على كوردستان العراقيـــة .

٤ ـ في الســـلم والديموقراطيـــة

# رزگاری

پارتی دیموکراتی کورد - عراق

العدد (٥) مارت ١٩٥٤ السنة الثامنة

ناضلوا لاحباط مشروع التحالف مع باكستان ـ تركيا . ضد الارتباط مع الاستعمار الامريكي والبريطاني .

الثمن (٢٠) فلسا

(( صادرة عن الجناح التقدمي ـ پارتي ديموكراتي كورد عراق ))

نناضل في طليعة الشعب الكردي :

١ ـ لتحرير العراق سياسيا واقتصاديا وآيديولوجيا من الاستعمار الانكلو ـ امريكي ومن حكم الطبقات الرجعية

٢ ـ لتحرير الفلاحين من الاقطاعيين وكبار الملاكين بالغاء التملك الاقطاعي للارض واعطاء الارض للفلاحين

٣ ـ من اجل ممارسة الشعب الكردي لحقوق الحكم الذاتي على كردستان العراقية

٤ ـ في سبيل السلم والديموقراطية

# رزگاری

لسان پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عراق

العدد (٦) نيسان ١٩٥٤ السنة الثامنة الثمن (٢٠) فلسا

ناضلوا لاحباط مشروع التحالف مع پاكستان ـ تركيا وضد الارتباط مع الاستعمار الامريكي البريطاني

سەروتارەکەی ل1- 4: (الکورد والعرب) و نوسراوە: مترجمة عن الکوردیة. سەرلەوحەی ئەم وتارە بانگەکەی مستەفا بارزانییە: "انني اوجه ندائي هنا الی الشعبین..."

ل4. عید العمال والکادحین الاممي

ل5. لتحیا ذکری شهداء 29 مایس

ل5- 6. الشعب الکوردي یؤید نضال الجزائر الباسلة

ل6 الاصوات ترتفع في کل مکان للمطالبة بوقف التجارب النوویة وتحریم اسلحة الإبادة الجماعیة

ل7- 8. کوردستان والنظام الدیمقراطي في العراق

ل8- 10. ان تجهل فاعلم

ل10- 12. سیاسة الحکومة وحقوق الشعب الدیمقراطیة

مام جەلال لە نامەی گۆڕینا نوسیویتی:

"کە رزگاری بو بە کوردی ئیتر پێویستیان بە گۆڤارێکی عەرەبیش هەبو، هەم بۆ بادینان و برا فەیلیەکانی بەغدا و تا رادەیەکیش بۆ خوێنەوارانی هەولێر، کە ئەوسا زۆر ئاشنای کوردی نەبون، هەم بۆ برا عەرەبەکانیش.

"وا پەسەند کرا کە جگە لە (رزگاری) ئۆرگانێکی تر هەبێت. لەسەر پێشنیاری مام جەلال (خەباتی کوردستان) پەسەند کرا. پێشتر پارتی لە ساڵی 1949- 1950 دا لە بەغدا لە لایەن لقی بەغداوە، گۆڤارێکی بە عەرەبی بەناوی (خەباتمان) چاپ دەکرد کە زۆربەی مەقالەکانی شەهید عەلی حەمدی و مامۆستا ساڵح روشدی دەیان نوسی.

"ناوی (خەبات) لەو گۆڤارەوە هات بە بیرا (کوردستان) یشی خرایە سەر.

"ئەو گۆڤارە بە عەرەبی دەردەچو زۆربەی مەقالەکانی مامۆستا برایم و مام جەلال دەیان نوسی. چاپەکەی بە رۆنیۆ بو. تایپ و رۆنیۆکەی مام جەلال دەیکرد بەهاوکاری خورشید شێرە و مەرحوم ساڵح شێرە کە مام جەلال لە ماڵەکەی وەکری پارتی دا دانیشتبو. خورشید نائیب زابت کاتب بو، تایپی دەزانی. بۆیە کەڵکمان لێ وەردەگرت.

"بڵاوکردنەوەکەی بە شارەکان دا زۆرتر کاکە (مەبەستی خوالێخۆشبو عومەر مستەفایە) پێی هەڵدەستا. ئەوە ماوەی کەرکوک.

"پاشان کە مام جەلال گوازرایەوە بۆ سلێمانی، تایپ و رۆنیۆکەش هێنرا بۆ ئەو ماڵەی کە ئەو لێی موختەفی بو، ماڵەکە هی باوکی خولە کۆمەڵە بو. خانوەکەش هی خوالێخۆشبو قادر تەگەرانی بو. ئەوسا زۆر لە دەرەوەی شار بو.

"لە سلێمانی زۆربەی نوسینەکان و تایپ و رۆنیۆکەی مام جەلال دەیکرد. ناوبەناو کاک هەمزە وتارێکی بۆ دەنارد، هەروەها مامۆستا برایم و کاک حیلمی.."

پێ ئەچێ هەندێ لە ژمارەکانی خەباتی کوردستان لە ئارشیفی دەزگاکانی ئاسایشی عێراقدا هەڵگیرابن. چونکە هەندێ لێکۆڵەر لە باسەکانیاندا ئیشارەتیان بە بابەتی هەندێ لە ژمارەکانی داوە.

حمیدي (ل230) نوسیویتی: ژمارەی کانونی دوەمی 1957 دژی سیاسەتی نوری سەعید و پەیمانی بەغدادی نوسیوە. رونی کردۆتەوە کە ئەو پەیمانە بە شێوەیەکی سەرەکی دژی جوڵانەوەی کورد بەستراوە لە عێراق و تورکیا و ئێران و، هەڕەشە لە ئاسایش و سەربەخۆیی گەلان ئەکا چونکە "دوژمنی کورد و عەرەب و ئاشتیخوازان و هەمو گەلانی دنیایە"

هەر لەم ژمارەیەدا وتارێکی لە سەر پشتیوانیی جەماوەری کورد دژی دەستدرێژی بۆ سەر میسر نوسیوە، دایناوە بە دەستدرێژی بۆ سەر گەلی کورد چونکە سەرکەوتنی دوژمنانی گەلی میسری تا ئەندازەیەکی زۆر گەورەترین زەرەر لە مەسەلەی رزگاریی کوردستان و گەلی کورد نەدا.

هەر حمیدي (ل258) نوسیوێتی: ژمارەی شوباتی 1958 بروسکەی پیرۆزبایی نوسیوە بۆ سەرۆکەکانی میسر و سوریا بە بۆنەی یەکگرتنی سوریا و میسرەوە. بەڵام لە بەیانێکی تردا دژی یەکگرتنی عیراق و ئوردون وەستاوە و داوای دابینکردنی مافی نەتەوەیی کوردی کردوە لەم یەکێتییەدا.(حمیدي، ل261)

## سەرچاوەکان:

رزگاری، خەباتمان، نداءکوردستان، خەباتی کوردستان، دەرکەی جوتیار. هەمو ئەم بڵاوکراوانەم لە مامۆستایان رەفیق ساڵح و سدیق ساڵح وەرگرتوە.

موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي، ستة اجزاء. بغداد، مطبعة الحكومة. 1948- 1949. کە لە ئارشیفی نەتەوەیی کوردستاندا هەڵگیراوە.

د. جعفر عباس حميدي، التطورات السياسية في العراق 1941- 1952.

د. جعفر عباس حميدي، التطورات السياسية في العراق 1953- 1958.

دەربارەی دامەزراندنی پارتی و گفتوگۆی نێوان حیزبە کوردییەکانی ناوەڕاستی چلەکان بڕوانە:

جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية. من منشورات النور. بغداد، 1969. هەمان کتێب بۆ جاری دووەم لە لایەن (دار الطليعة) ەوە لە بێروت چاپ کراوەتەوە.

صالح حیدری، یادداشتێک دەربارەی حیزبی رزگاری کورد کە لە ساڵی 1945 لە کوردستانی عیراقدا دامەزرا، دەفتەری کوردەواری، ژ1، کانونی دووەمی 1970. ل47 - 55.

د. کەمال مەزهەر: رزگاری لە کفری، کتێبی: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد. بەرگی دووەم. ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی. هەولێر 2001. ل381 - 387.

کۆمەڵێک ژمارەی (رزگاری) و (نداء کوردستان) و (دەرکەی جوتیار) لە ئەرشیفی کاک محەمەدی مەلا کەریم وەرگیراوە.

بەیاننامەکانی پارتی لە (ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان) وەرگیراوە.

## پاشكۆ:

**1 – قانونی چاپەمەنیی عوسمانی 1865**

**2 – قانونی مافی دانانی عوسمانی (قانون حق التألیف العثماني) 1910**

**3 – قانونی چاپەمەنیی عیراق 1933**

# قانونی چاپەمەنیی عوسمانی 1865

## بەشی یەکەم
## بابەتی گشتی

مادەی 1:

رۆژنامە و سایرە کە بابەتی سیاسی و حکومەتی بڵاو ئەکاتەوە، بە هەر زمانێ بێ، چ بە رێکوپێکی لە کاتی دیاری کراودا دەربچێ و چ بەش بەش لە کاتی دیاری نەکراودا، بە بێ ئیجازە ناتوانێ بڵاو بکرێتەوە.

داواکارانی ئیمتیازی ئەم پەخشە و رۆژنامانە ئەگەر رەعیەتی دەوڵەتی بەرز بن عەریزە ئەدەن بە وەزارەتی علوم و، ئەگەر رەعیەتی بێگانە بن بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بۆ ئەوەی ئیجازەی پێویستیان بدرێتێ لە لایەن ئەو دو وەزارەتەوە، مادەی سێیەم دەرحەق خاوەن عەریزەکان جێبەجێ ئەکرێ، بەڵام ئیجازەنامەیان ئەبێ لە لایەن ئیدارەی ئینتیباعاتەوە بدرێتێ.

مادەی 2:

ئەو کەسانەی لە ولایاتی شاهانەدا ئیمتیازی ئەم جۆرە رۆژنامە و پەخشانە ئەخوازن ئەبێ عەریزە بدەن بە حاکمی ولایەت. ئەگەر رەعیەتی دەوڵەتی بەرز بێ بۆ وەزارەتی علوم ئەنوسێ و ئاگاداریان ئەکا. ئەگەر رەعیەتی بێگانە بێ بۆ وەزارەتی شکۆداری کاروباری دەرەوە ئەنوسێ. ئەگەر مەرجەکانی م3 یان تێدا بێ ئیجازەنامەکەیان بۆ حاکم بۆ ئەنێرێ.

مادەی 3:

کەسێ کە ئەیەوێ رۆژنامە دابمەزرێنێ، ئەگەر رەعیەتی دەوڵەتی بەرز بێ، ئەبێ تەمەنی لە 30 ساڵ کەمتر نەبێ و، بە تاوانی جنحە و جنایت سزا نەدرابێ و، خاوەنی مافی تەواوی کەسایەتی خۆی بێ، لەم حالەتەدا ئەتوانێ ئیجازە وەربگرێ.

ئەگەر رەعیەتی بێگانە بێ، ئەبێ وەکو رەعیەتی دەوڵەتی بەرز پێڕەوی مەرجەکانی ئەم قانونە بکا، لە کاتی روودانی تاوانی چاپەمەنیدا رەفتارێ کە لە گەڵ رەعیەتی دەوڵەتی بەرز لە دیوانخانە و دادگادا ئەکرێ بە هەمان تەرتیب و ئوسوڵ بەرامبەر بەویش ئەکرێ. ئەگەر ئەم مەرجانەی قبوڵ کرد، ئیجازە بەویش ئەدرێ.

مادەی 4:

لە گەڵ عەریزەیەکدا کە لە م1 دا باس کرا توغراسەنەدێ بە مۆر و ئیمزاکراوی باسی ناوی رۆژنامە و ناوی چاپخانە و بەڕێوەبەری بەرپرسی و رۆژانی چاپی، کە چەن رۆژ لە مانگێکدا چاپ ئەکرێ، ئەبێ پێشکەش بکا. بەڕێوەبەری رۆژنامە بە قەڵەمی خۆی دانەیەک ئیمزا ئەکا و ئەینێرێ بۆ ئینتیباعات دوای ئەوە نسخەکانی تر بە ئیمزای خۆی چاپ ئەکا. لە ولایەتەکاندا پێشکەش بە حاکمی ولایەتی ئەکا.

ماددەی 5:

کاتێ کە خاوەن و بەڕێوەبەری ڕۆژنامە و بڵاوکراوە ئیجازەکەی خۆیان بدەن بە کەسێکی تر، ئەبێ ئاگاداری مەرجەع بکەن. هەمان کەس ئەبێ بە پێی ماددەکانی 1 و 2 و 3 ئیجازە وەربگرێ. ئەگەر ڕۆژینامەکە و چاپخانەش بگۆڕێن ئەبێ ئاگاداری مەرجەع بکەن.

ماددەی 6:

ڕۆژنامەی سیاسی کە ئێستا لە ئەستەموڵ و مەمالیکی شاهانەدا دەرئەچن لەم ئیجازە ڕەسمییە بەخشراون و حوکمی ئیختار و ئیعلان دەربارەیان هەڵوەشێنراوەتەوە، بەڵام دوای ئەوە ئەبێ هەموویان پێڕەوی ڕێنماییەکانی ئەم قانونە بکەن.

ماددەی 7:

لە پایینی هەر وتارێ یا باسێکا کە لە لایەن یەکێکی ترەوە لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو ئەکرێتەوە ئیمزا ئەکرابێ، ئۆباڵی ئەوە لە ئەستۆی هەمان ڕۆژنامەنوس دایە کە ئیمزای کردوە. ئەگەر ئیمزای نوسراو بە پێچەوانەی ئەم قانونەوە بێ، خاوەنی ڕۆژنامە و نوسەری وتار هەردو لە بەرپرسیارێتیدا بەشدارن.

ماددەی 8:

ئەگەر لە سەرۆکایەتی ئینتیباعاتەوە لە ئەستەموڵ و لە لایەن حاکمی ولایەتەکانەوە نوسینی ڕەسمییان بۆ بنێردرێ، بە بێ داوای پارەی نرخەکەی ئەبێ لە چاپی یەکەم و دوەمی ڕۆژنامەدا بنوسرێ. ئەگەر لە ڕۆژنامەدا ناوی کەسێکی بەڕێز بە ئاشکرا یان بە کینایە ببرێ و ئەو کەسە وەڵامنامەیان بۆ بنێرێ ئەبێ لە چاپی یەکەم و دوەمدا بێ پارە بڵاوی بکەنەوە، بەو مەرجەی لە دو ئەوەندەی وتارەکەی پێشو درێژتر نەبێ.

ماددەی 9:

ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی تر کە بابەتی سیاسی و جیاوازی تێ دایە و بەدگۆیی بەرامبەر دەوڵەتی بەرز کردوە و بیری دوژمنایەتی هەیە و، لە مەمالیکی دەرەوەدا چاپ ئەکرێ، گەیشتنی بە مەمالیکی پارێزراو قەدەغەیە.

## بەشی دوەم
## دەربارەی سزادان

ماددەی 10:

هەرکەس بە بێ ئیجازەی دەوڵەتی بەرز، واتە پێچەوانەی ئەم قانونە، ڕۆژنامە یا پەخشە دابمەزرێنێ و بڵاو بکاتەوە بۆ هەر نسخەیەک یا جزوەیەک 10 لیرەی زێڕ تاوانەی لێ ئەسێنرێ. ڕۆژنامەکەشی دائەخرێ.

ماددەی 11:

هەرکەس بە حوکمی م4 ی ئەم قانونە نسخەیەکی ئیمزاکراو بۆ مەرجەعەکەی خۆی یا بە بێ ئیمزا بڵاو بکاتەوە 10 لیرەی زێڕ تاوانەی لێ ئەسێنرێ.

